ئامادە کردنی:

تایپی کوردeکا

بۆکان، پاساژی عەباسی ☎ ٦٢٤٣٤٢٥
محەمەد ئەمین شاسەنەم: ٦٢٢١٣٤٠
عەلی جەوشەنی: ٦٢٤٢٩٢١

سەرەتا وشە بوو

وشە داهێنەر بوو

داهێنەر تەنیا بوو

# یا داهێنەر

هەر هیچ ... تەنیا!
شێعر
«ساماڵ»
محەمەد ئەحمەدی
ئینتشاراتی عابید – تاران
چاپی یەکەم ـ ١٣٨٠
ئەژمار: ٥٠٠ دانە
رووبەرگ: کاری هونەرمەند موحەمەد رۆستەمزادە
پیتچن: خوالێخۆشبوو عەتا بەرفی، سەقز

به یادی رۆحی شێعرینی کاکمەوە

پێشکەشە بە:

چرۆی یادگار حەمە گیانی برازام و

ئەو شێعرانەی لە دوایین دیوانمدا

دەنووسرێن

## هەراسانی

(١)

خۆم لە تۆزی خەون و

باوێشک

دە

تە

کێ

ن

م

رکەی مێژوو

لە گرێژەنەی دزێوی دەبەم و
پەرەوازەی جوانی دەبم
هە   را   سا   نم
ئاسمانێک..
لە بناری پەنجەرەڕا هەڵمدەگرێ
من سواری ئەسپی ئەستێرەیەکی هەراسانم
بە عیشقی هەڵفڕینەوە... دادەگیرسێم
من ئاوەڵدوانەی سووتانم.

سووتانی من..
پرسیاری هەڵوەرینی گوڵێکە لە ـ با ـ
سوێند خواردنی دڵۆپەیەکە بۆ دەریا
دیمانەیەکی مێشکمە لەگەڵ دڵ...

تۆ ئەی ئەوەی عیشقت لە بن رەگاندایە!
کوا ئەو خاکەی پیری تەریقەتی جوانیمان تیا ناشت؟
بیکەینە متفەڕک و دۆعای چاوەزار...
بۆ دارستانی ئارەزوو

دەمەوێ تارمایی نێو ژووره تاریکەکانی «وشە» ببینم
بچمە غوبارستانی رۆحی شێعرەوە
چیرۆکی نامەکانی خۆم و یارم

بۆ غوربەتی جوانی بکەم بە سروود...

لەکوێی؟!
ناسناوێ بۆ سووتان بدۆزینەوە
لە نێوان ـ گەشانەوە و هەڵچوون ـ دا
مانایەک بۆ حەقیقەت لێکدەینەوە
لە نێوان ـ هاوار و بێدەنگی و هیچ ـ دا
خاوەنێک بۆ باغچە بدۆزینەوە
لە نێوان ـ باڵندە و ـ باـ و بەهار ـ دا

(٢)

پێڵووی خەزانیت هەڵێنە!
گەڵای سەوز.. سەفەرنامەی بەهارە
گەڵای زەرد.. سەفەرنامەی پاییزە
منیش سەفەرنامەی تۆم
ئەی ساڵ دەری دوازدەی مانگێم خۆشەویست!
خۆزگە ـ با ـ یەک
هەڵچوونی لە دابڕانمان دەپێچا
خۆزگە دووری

چرکەیەکی هەراسانی تێگەڕابا

(٣)

وەرە پشتی گومان بشکێنین!
وەرە لە جەنگەی تاریکە شەواندا
ماچی شۆڕشگێر و پێکەنینی شەڕزە بدوێنین!
وەرە هێندە باڵ لەیەک دەین
تۆفانی هەڵفرین هەستێ!

بۆ ئاخاوتنی رۆح

وەرە فێری زمانێک بین
مەرگ پێی نەخوێندرێتەوە!

«هەتاکوو گەورەیی چاوی تۆ
ببێتە زمانی جوانی»

بۆ ئاخاوتنی هەڵچوون
وەرە لە کفل و کوونێکدا
نیگایەک بگۆڕینەوە!

«هەتاکوو هەراسانی من
ببێتە حیکمەتی لەززەت»

تۆ لەتان و پۆی شکدا دەتەنن
من لە ئاهەنگی هیچ ـ دا دەژەنن
ئێمە لە مۆعجیزەکاندا دەخوێننەوە

«هەتاکوو دەربەندی هەستی
پڕ کەن لە ڕەشەداڵی هیچ!!»

(٤)

تۆ دەنکە تەرزەیەکی لە پشکۆی دەروونمدا
ڕەحمت بێ بە حەجمینی دڵم
پڕ .. پڕ .. پڕت کردوە لە قریشکەی چارەنووس
پڕ .. پڕ .. پڕت کردوە لە نووکە نووکی کابووس

سەفەرە .. سەفەرە .. سەفەر
بەرەو بۆشایی حەشری ئاوێنە
کە ناکۆتایی ئەو حەشرە..
جەمسەرێکە بۆ من و تۆ و
باڵە گوڵاڵەییەکانی جوبرەییل
مەیخانەیەکە بۆ من و تۆ و
نۆشانۆشی بادەی ژیان

سەفەرە .. سەفەرە .. سەفەر
بە شاری ئەو پەپوولانەدا
کە بە سووتان قەرزدار نین
بە گوندی ئەو گەڵایانەدا
کە دەستیان تێکەڵاوی پایز ناکەن
ئەم سەفەرە

مەودای نێوان مێشک و دڵە

ئەم سەفەرە

سرتە سرتی بۆن و گوڵە.

(٥)

لەکوێی ؟!

ئەی ئەوکاتەی تەنیاییت تیا نییە!

جڵەوی هەراسانیم رابکێشم تا بەردەمت

من چنارێکم

داهاتم کرێی باڵامە

کوێستانێکم

کاسپیم بەکرێدانی کانییە

کوای؟!

ئەی ئەو ژەمەی ناوی برسیەتی نازانی!

سفرەکانی رۆحم

لە دیوەخانی تۆ راخەم

لەکوێی .. لە کوێ؟!

ئەی ئەو چاوەی...

فێرت کردم.. بچمە ناخی ئەندێشەی دەریاوە!

جڵەوی هەراسانیم .. بدەمەوە دەست هێمنیت

چم لێ دەکەن!

چم لێ دەکەن!

«هەراسانیم هەر شێعریکە و
نهێنی وشەکانی دەگۆڕێت»

(٦)

مەودای من و هەراسانی
تۆی تۆ ...
ئەی سەماکەری چەمەرییە نهێنیەکانی رۆحی من!
لە ژێر هەورەبانی سەرمدا
سێبەرەکەت .. رووناکییە
جوانییەکەت .. ئازادییە
پێکەنینت .. هەڵفڕینە
هەڵفڕینیش گەشکەی ژینە

ژین بە رێزمانی ئیمپراتۆریەت دەنووسن
ئێمە رێزمانی هەڵفڕین دەزانین

با گوللە تێنەگا
مەرگی ئێمە لە ژەهری ئەودا مەییوە
با ڕ نەزانێ
تۆرانی ئێمە لە گرژی نێو چاوانی ئەودایە
با تەنیا هەڵفڕین بزانێ

چەندە هەراسانی یەکتر بووین!

دووری ..

بەدمەستی مەیخانەی ژیانە و

پیاڵەی ئارەزوو دەشکێنێ

هەڵفڕین ڕەزێکە ..

دار بە دار و

گەڵا بە گەڵا

قەهری خودای لێ دەبارێ

کۆترێکە ..

پەڕەوازەی جوانی دەبێ

ڕەمزێکە ..

خاڵی لە جادووی دابڕان

هەڵفڕین ..

شەکەتبوونی کپی و بڕستی هاوارە

من هەڵفڕینم کردۆتە پارسەنگی نیگای تۆ

هەڵفڕین یەقینی منە

کە هەڵفریم :

مەهێڵە برینەکان بە دواما بێن!

وە بیرم بێنەوە دوایین عیشوەی تۆش

لەنێوان هەر دوو باڵمدا هەڵگرم ..

بۆ نامۆ بێ؟

بۆ هەراسانی تێنەگا؟!

من لە عیشوەیەکی تۆڕا شێت بووم!

بۆ ئاسمانیش نەزانێ

من لە نیگایەکی تۆڕا باڵم گرت!

ئاسمان ماچێکی پێداوم

تامی ڕووناکایی دەدا

بۆچی زەمان .. چرکەیەک راوێستانی تیا نییە؟

بۆچی شوێن .. جێگایەکی خاڵی نییە؟

من بە بێ تۆ ..

راوێستانم!

خاڵی بوونم!

با ئەوین بزانێ

لەگەڵ یەکەم نیگای تۆ

یەکەم شێعری من پشکووت

با خەونیش تێبگا

لەگەڵ روانینی مرۆ

دوایین شێعرم دەخوێنمەوە

من شۆڕشی تاوانم

لە حەشری هەراسانیدا

(٧)

مەگری .. گریانی تۆ ماندووبوونی یەقینە!

مەڕۆ .. ڕۆینی تۆ ترپەی داکەوتنی سێوی وەفایە!

چاوم لێکە.. ڕوانینی تۆ یەقینی مەیخانەی ژیانە لەترێیلەززەت!

دەمەوێ شێتبوونم

وەک خەونێک لە ڕۆحتدا تۆمار بکەم

دەمەوێ هەراسانیم

بۆ ئارامیت بدرکێنم

دەمەوێ هەناسە دەرچووەکانم

لە هەناسەت هەڵمژمەوە

هەوا پڕە لە تلیاکی مردن

دەمەوێ بە قەت ئەستێرەی ئاسمان

منداڵم بێ و

هەموویان ناو بنێم ئەوین

دەمەوێ بە قەت گەڵای دارستان

یارم بێ و

به هەموویان بلێم «چاو جوان»
بەڵام ویستن ...
کوا بەرگەی هەراسانی دەگرێ؟!

(٨)

ئاسمانم چاوە و
جوانییە، مەودای روانینم
جۆغرافیام سووتانە و
سنوورم گڕ
وڵات پشکۆ .
دەرفەتم بێ بۆ وتوویژێکی دەرەوەی خۆم:
یەکەم شت .. پەنجەرە دەدوێنم
زەمانم پێ دابین کرێ:
یەکەم وەرز .. ناو دەنێم مردنێکی نوێ
دەسەڵاتی شوێنم هەبێ:
یەکەم جێگا .. بەناوی تۆوە دەکەم
بەڵام هەراسانییە بەشم
ئەی کۆچی بێ برانەوەی ـ با ـ!
من ئاوارەی نێو خۆمم

نە چاوەڕێم کە .. نە وەدوام کەوە

من هەراسانیم لەگەڵە
ئەی ئەو کەسەی .. هەر بەتەمای ..
ئارامیی دەریا بچنیەوە!

(٩)

پەنا دەبەمە بەر بەهار
گەزیزە دەمکاتە دوژمنی تەمەن
دەمەوێ روو لە هاوین نێم
درەختەکان میوەی جودایی دەفرۆشن
دەستەوداوێنی پایز بم
نازی هەڵوەرین دەمکووژێ
بە زستانیش .. کلیلە بەفرێکی پیر
بۆ ترس دەچەمێتە
من ساڵێکم .. وەرزێکم بە کەیفی خۆم نییە
خۆم لە باوەشی ـ باـ داوێم
با غەیبانی بم، غەیبانی ...

(١٠)

تۆ هەزارەمین نامەی سووتانی
لە ساڵی پەپوولە باراندا
تۆ کێشەی بێ ژماری پاکیی
لە ململانێی تاواندا

تۆ دایکمی .. دایک
من لە تۆڕا دەست پێدەکەم
تۆ خاکمی .. خاک
من لە تۆدا کۆتاییم دێ

(١١)

پەشیمانی بوو .. ئەوەی بەرگری لە زینای خۆر و گوڵ دەکرد
نەگبەتی بوو .. پێشوازی لە ئەفسانە دەکرد
نەهاتی بوو .. ئەو هەورەی ئاسمانی داپۆشی
بێ ئاسمانی ..
تەشقی هەڵفڕین دەشکێنێ
بێ ئاسمانی ..
جەمسەری کۆتایی دەپسێنێ
بێ ئاسمانی ..
هەراسانی .. سەرگەردانی ..
من لەشی رووتی کچە رازێکی دەروونی خۆم دیوە
شەرم و حەیای لێ هەڵگرتووم
جنێو دەدەم بەو هەورانەی .. لەشی ئەستێرە داپۆشن!

گەمە دەکەم بەو خەمانەی .. دەبنە پەردەی پەنجەرەی دڵ!
کایە دەکەم بەو سەبرانەی .. لەززەتی ئێستام

بۆ نازانم کەی هەڵدەگرن!
لەشی رووتی کچە رازێک ..
بێحەیایی .. ناتەبایی .. هەراسانی...

(١٢)

رۆژی گوڵی .. مانگی پەپوولە ..
دێمەوە لات
لەچکەیەکی لە زەمان چنراوت بۆ دێنم
تەمەنێکیش هەراسانی
ئەگەر دووریش پیری کردین
من لاوەتی هەردووکمانم
لە لەتە ئاوێنەیەکدا هەڵگرتووە
«تەمەن پیر بێ، دڵ پیر نابێ
هەراسانی
دەست لە جوانی هەڵگیر نابێ

(١٣)

رۆژ ئێواران بە جێم دێڵێ .. بێوەفایە!
شەو بەیانیان تەنیام دەکا .. بێوەفایە!

لە کوێی؟
ئەی یاری هەمیشەم!
لە کوێی .. لە کوێ؟!
هەراسانییەکم دڵنیا لە شێتبوون و
پێدەکەنم
پیاوەتییەکم دڵنیا لە جوانی تۆ و
خەو دەبینم

غیرەتێکم دڵنیا لە ترس و
گەمە دەکەم
بەڵام هەرگیز جودایی نیم
دڵنیا بم لە دووری تۆ و
خۆم بە هەڵفڕین نەسپێرم
لە ئاسمانا دانەگیرسێم!

(١٤)

بۆ منداڵی من مەگەڕێ! ..
لە خەونێکدا گڕووی گرت و
ئیتر نەمدی

بۆ لاوەتی من مەگەڕێ!
پەنجەرەیەک فریوی دا و
سەری تیا برد

پیریشم ئێستا نەدیبوو
بە هەراسانیدا چەمیەوە
چم ماوە بۆ گریانی بدرکێنم!
چم ماوە بە خەمی بسپێرم!

(١٥)

هەموو شوێنێک
لە هیچ کوێدا ..
هەموو کاتێک
لە هەرگیزدا ..
تەواو دەبێ

تۆ
نە کاتی .. نە شوێنی ..
لە کوێ !
کەنگێ!
تەواو دەبی

هەر دێی و دێی

**ناتبینم!**

**دەڕۆی .. دەڕۆی و**

**ون نابی!**

بانەمەڕ و جۆزەردانی ١٣٧٧

بۆکان

## شەهید

ڕووباری خوێن
بۆ ئاودێریی زامەکانت
پڕ گوڵدانێ گەڵای شێعر
کفنی بەرت
هیچی ترت بەر ناکەوێ
هاوڕێیانی دیش بەڕێوەن!

٧٤/٥/٢٥
بۆکان

# خەمی پاییز

«بۆ هاوڕێی شەو و ڕۆژم «عەباس ئارام نەبی‌یار»

هەناسەی ـ با
ئاوازی خەمی پاییزە
«چەند دڵ تەنگە!»
هەوری سپی
بزەی سەر لێوی دەریایە
کە دەمدمانی خۆر دەبێ
«چەند دڵ خۆشە!»

**هەناسەی ـ با ـ**

**هەوری سپیش دەگریەنێ**

**ئاخ .. ئاخ!**

**«خەمی پایز چەند**

**گرانە!»**

٧٤/٦/١٠

بۆکان

# شەرم

بالـ ی ئەویندار
قژ ئالۆزکاو ..

هێور

هێور

تێ دەپەڕی

لە کۆڵانی باغچە یەکرا
بە پێکەنینەوە گوڵێک
نەرم لەچکەکەی بۆ لادا و

سوور هەڵگەڕا ..!

٧٤/١١/٢٧
بۆکان

# زمانی خاک

(١)

ئەگەر مردم

با هەر بە رووتی بمنێژن

بە تاسەوەم ..

کفنێک لەم خاکە پیرۆزە لەبەر کەم !

(٢)

به خاكم كوت:

به چ زمانێك ئەدوێی؟

جوابی داوه

به زمانی ئەو كەسەی كە تێمدا دەژی

(٣)

خاك پێكەنی .. گوڵێك روا ..

باڵندەكان ..

بۆ پشكووتنی گوڵ و

پێكەنینی خاك

گۆرانی دەڵێن!

(٤)

هەور ..

دڵی پڕ پڕە لە ماچ و

ئەیبەخشێ

بە گوڵەکانی خاک

(٥)

خاک؛ دارستان لە باوەشیا گەورە دەکا

دارستان؛ دەسک بە پێمەڕە دەبەخشێ

پێمەڕەش؛ سنگی خاک ئەدڕێ ...

ئەی دایەگیان!

تۆ منت بۆچی گەورە کرد؟

(٦)

له تاریکایی دڵی خاکا

ڕەگی دار و گوڵ و گیا

یەکتری لە ئامێز دەگرن

لە ژوانێکی ئاسوودەدا ...

(٧)

خاک ژیانە ... ئەگەر بێتوو خۆشمان بوێ!

وە ـ مەرگیشە ..

ئەگەر بێتوو خۆشمان بوێ!

ڕەشەمەی ١٣٧٤ ـ بۆکان

* کۆپلەی یەکەم تروسکەی شێعرێکی «شاملوو»یە.

# سەفەر

شێعر : ئاوێنە

چاوت : ڕێبوار

تا کۆتایی ئەم سەفەرە

ئاسمان بۆ تەمەنی من کورتە و

ئاسۆ بۆ تەمەنی تۆ نەوی

٧٥/٣/١٢

بۆکان

# وەرزی خۆڵەمێش

ئەی شۆخەکەی سەرگەردانی!
باڵندەی ئەم سەرە شێتەم ... هەڵەڕۆ بوو
نەیدەزانی ..
نە چاوت ساماڵە و
نە دڵت گەرما
نە قژت باخە و
نە دەستت فێری باڵەفڕێی دەکا!
* * *
هۆ گۆڕیچەی دوا هەناسەم!
ئێستا ...
گوێت لە دەنگم دەبێ یان ـ نا ـ !

ئەتۆ چاوت
لەم جیهانە گەورەترە و
ئەمن دل
چاوی ئەتۆ و
سەدان خەمیشی تێدایە!

پایزی ٧٥
تەورێز

# ئەفیوون

ئاوێنە و گوڵ ..
دەمامک و ئەفسانە!
ناوی یار و ژێی گیتار ..
گۆرانی لەبیرچوونەوە!
هەر دووکەڵی جگەرەکەم ...
هه ر د و و که ڵی ج گه ره که م!

!

٧٥/٧/٢
تەورێز

# پایز

ئەو شۆڕەبیە

قژەکانی لە باوەشی هاڵاندووە

با ـ نەیانبا

ئەی رۆحی خۆم!

لە قووڵایی سینگمدا بە

پایزە ..

پایزە

پایز!

٧٥/٨/١٥

تەوریز

# کۆماری چاو

شنەی چاوت
باسی شادییە بچکۆڵەکانی باڵندە و
ترووسکەی یەکەم رووناکایی دەکا
تا کۆتایی
تا نادیاری
بە دواتەوەم ...
نە دەریا
نە زەوی
نە ئاسمان
هەر هیچ ... تەنیا
ئەو سنوورە باڵا نەکا و

ئەو پەنجەرە جێم نەهێڵێ!

***

وتووێژی گەیشتنی میوەی کاڵ و

بێدەنگی دار ...

هەتاوی عەسرانەی پایز ...

خەیاڵی خاڵیی باران ...

گەڵا دەڵێ:

هەتا پایز نەمردبێ

خۆ کوشتنە لەدایکبوون !

دایکم دەڵێ:

کێلەکانم وەکوو دڵ بن!!

تۆش ...

رۆژێک با ـ هەڵدەکا و

دەڕۆی ...

ئیتر لە مێشکی ئاوێنەدا ناگونجێ

رەنگی سەوزی تۆ و

کۆماری پایز ...!

* * *

نابیسترێ دەنگی شێعر

بۆ چاوەکانی گوێ دەگرم ..

زستانی ١٣٧٥ ـ بۆکان

# حەرفێکی لە دەنگ زیاتر

ئەم تەنیاییە ڕەجم کە و

برۆ!

ئێرە لە جیاتی ڕاژەندن .. دەتشڵەژێنێ

ئێرە لە جیاتی مەرهەم .. زامدارت دەکا

ئێرە دوورە لە بەهەشتەوە، دوور

ئێرە چرکەیەکی ماوە بۆ مەیدانی هەڵواسینی زەمان

هەستە برۆ!

دوودڵی ژمارەیەکە
تەنیا لە بە سەرکردنەوەی تەنیاییدا دێتە ژمار
بپارێوە!
نوێژ بکە بۆ ئەو دەستانەی پەنجەرەی دوودڵی دەسڕن
بچۆ دیداری ئەو باخەی
دارەکانی سەر بە سەری یەکا دەگرن

## لە چاوتدا بارانێکی تێدایە

## نەڕۆی

## ئاسمان تووڕە دەبێ!

ئێرە زاوزێی تەنیایی و
وێردی بەردە بە گوێی دڵدا
خافڵ مەبە!
تۆ دەبێ باجی برینەکانی سەردەمی منداڵیشت
هەر ئێستا بدەیەوە!
تۆ دەبێ سێبووری منیش بی
من کە لەگەڵ هیچ برینێک بەراورد ناکرێ دەردم!
خافڵ مەبە!
دوو دڵۆپەی باران لێکبچن و نەچن

مردن هەروەکوو خۆیەتی

ـ مەبەست وریابوونەوەی

زەوییە! ـ

قەفەس گەورە بێ یان بچووک

سەربەستی هەروەکوو خۆیەتی

ـ مەبەست بیرهاتنەوەی

هەڵفڕینە! ـ

***

مەپرسە بۆچی ...

هەر لە منداڵیمەوە رەنگی پیریم لێنیشتووە!

مەترسە تۆی گوڵ ...

لە تەمەنی مندا بەهارێک نەبێ تیای بڕوێی

هەڵوەرینیش جەسارەتێکی دەگمەنە، ئازیزم

ئەگەر شەهادەتی هەڵوەرین نەبوایە!

من نەمدەکوت: خانم

تۆ پاراستنی کەلتووری باخ و

تۆ لەززەتی جوانی چیمەن و

تۆ بۆنی بووژانەوەی بەهاری ...

من دەمزانی

تۆ هەموو شەوێک لەنێوان مانگ و پەنجەرەدا دەخەوی

هاتم «سینگە هەورینەکەم بۆ ڕاخستی» و

کوتم: جوانێ!

من تێکەڵاوێکم لە باڵندە و مرۆ و باران

حەزم لە تۆیە و لە باغ

من دادپەروەرییەکم لە شەو و مەرگ و خوێن

دەمەوێ خۆم بەسەر تۆدا بەش کەم

تۆ نوتفەی ئەم نیازانەی منت کرد بە منداڵ

منداڵ ..

هەموویان تۆ بوون

هەموویان من بوون

منداڵ ..

پەلەپەلی تەمەنی ئێمە بوون

خافڵ مەبە!

خەریکە لە هیچەوە پیر بین

***

بەڵام تەمەنی دیکە هەیە

بێجگە لە منداڵی و لاویی و پیری

لەو تەمەنەدا ...

گەردنی تۆ پڕە لە ملوانکەی مانگ

هەناسەی من پڕە لە بۆنی مێخەک و شەمامە

ئەو تەمەنە زەمان نییە

هێشوە ترێیەکە لە مەستیدا بێهاوتایە

تێکەڵاوێکە لە ڕەنگی مانگ و خوێن و بەیانی

لەو تەمەنەدا ...

باجی برینەکان بە لۆکەی پێکەنین ئەدەینەوە!

بۆ ڕێزگرتنی سوننەتەکانی مێژوو

کۆنگرەی ـ با ـ دەگرین!

بۆ ڕەچاوکردنی یاساکانی سیاسەت

دەبینە سەربازی لافاو!

ئەو تەمەنە دەرەوەی زەمانە

منم لە دەرەوەی من ..

تۆی لە دەرەوەی تۆ ..

ئەگەر بەو تەمەنەم نەزانیبا!

نەمدەکوت:

جوانییەکیتر هەیە بۆ جوانی

هەورێکی تر هەیە بۆ باران!

دەربڕینیتر هەیە بۆ شێعر!

***

خافڵ مەبە!

لێرە من گوڵ دەچێنم و

تاسەی بۆنی تۆ نایەڵێ بۆنی کەم

بێ تۆ ئیتر ..

منەتی تەنیاییم پێهەڵناگیرێ

هەناسەم نابێتە دووکەڵی بەنگی خەم

ئەی خوماری ئارەزوو!

لەکوێیە؟ کوا!

ئەو عیشقەی لە خولیابوونیشا نەماندی!

ئەو ژیانەی لە زیندووبوونمانا بزر بوو!

ئەو کۆنبوونەی لە رابردووشماندا نابینرێ!

مێژوومان نییە

کوا؟

ئەگەر هەبا!

لە بەر غەزەبی تەمەنێکی بێزەماندا پیر نەدەبووین

من لە هەڵپە داناکەوم

بیرم لای حەرفێکی لە دەنگ زیاترە

بیرم لای ئێستایە و کوردستان

ئێستایە و تۆ

ئێستایە و هەمیشە ...

من لە ژیان زیاتر دەژیم!

لە وەسڵی خاک و خوێن گووراوم

من لە مردن زیاتر دەمرم!

ئەوەی بۆنی تەنیایی بەسەردا دەچێ و نامرێ

ئەوەی بۆنی خوێنی گوڵ دەکا و نامرێ

ئەوە مەرگ لێی دڵپیسە!

جوانی لە خۆی نزیکترە تا شتیتر

من لە هەڵپە داناکەوم

تاکوو جوانی ...

ناحەزی نزیکترین رێیە!

جوانی دەروونی تۆیە

تا ناخی تۆ ..

زەمان نزیکترین ڕێیە!

ئەی ئەوەی لە ڕۆحی پرسیارەکانی خۆم بە بەردا کردی!

چاوەڕوانیت شەقڵی شکاندم و

نەهاتی ...

مسک نییە، نا!

ئەم تەنیاییە ئاوەدزی برینی ئاسکی لێ

دە

چۆ

ڕێ

چزووی مارە لاواندنەوەی ئەم مێژووە!

خافڵ مەبە!

ئێرە پەرداخی شەرابی شایەکی پارسە و

پڕە لە خوێنی عوزری کچە ماددێکی ناسک

لێرە هەر شێعری مەجنوونە و

خوێنی ئەم پیاوە جوانانە

ئەکاتە خەنە بۆ پەنجەی لەیلایەکی ڕەش

کێ دەڵێ:

من و تۆ .. لە تێگەیشتنی باراندا پەڵەمان نەداوە!

کێ نایەڵێ:

ئێمە نەخشەی ماڵەکەمان

لە بیری بەرزەفڕینی هەڵۆ بێ!

خانم!

مێژوو درۆیەکی زلە

نەبا!

حاشای لە قاقای منداڵی نەدەکرد ...

نەبا!

شکی لە کۆتر و قومری نەدەبوو ...

***

دڵم تەنگە!

نە چرکەیەکی بۆنخۆش

دەمکاتە بڕکە و

شەمامەی بێدەنگی بگرم

نە راستەقینەی حەرفێک

دەمکاتە دەنگێکی رەوان و

رازی دڵم بدرکێنم

دڵم تەنگە!

ژیان درمەدرمی ئاهەنگی مەرگی لێوە دێ و

رۆح بێدەنگە!

رۆح بێدەنگە!

تەنیاییم لە ترێ مەستترە!

تەنیاییم لە مشووری هاتنی تۆدایە!

تەنیاییم عاشقی تێکەڵبوونێکی مەبارەکە!

ـ وەک زینای خوێن و خاک ـ
ئەی کەشکۆڵی بە ویژدانی گوڵ!
چۆن هەڵنەوەرای لە رەزبەری تەنیایی مندا ... چۆن؟
ئاخر تۆی لە ناسک ناسکتر!
چۆن بەم چڕییەی رێدا هاتی ... چۆن؟!

***

وەڕەزم لە منی بێ تۆ!
وەڕەزم لە زەمانی تەپلۆس!
بمرێ عیرفانی سیاسی
هەر بژی کفری جوانی!
خاپوور بێ نوێژی کۆموونیست!
ئاوا بێ کفری گوڵ ...
کفری ئاو ...
کفری تۆ ...
ـ کە نەمکردبایە شێت دەبووم! ـ
نوێژم ناچێ
لە مردنیش ترسم نییە
ئەوەندە دەترسم بمرم و
فریای گەردنئازایی باڵندە نەکەوم
باران .. دڵی لە چەترەکەم هێشابێ
خاک عافووم نەکا و
فریای ماڵئاوایی شێعر نەکەوم!

من لە مردن زیاتر دەمرم

ئەی ئەودیوی دنیای مردن!

هەڵیدەوە چادری من لە هاومالەتی ـ با ـ دا ...

بینووسەوە شێعری من .. لە هەڵمکردنی خەون و

هاڵاوی

عیشق ..

هەڵیوەرێنەوە تەنیایی من

بۆ

سەر شکی یەقین ...

دووپاتی کەوە حاشای من

لە خوێندنەوەی غەیبی دار مێو ...

بیگەیەنەوە خزمایەتی من بە پشتاوپشتی عیشق ...

ئەی ئەودیوی دنیای مەرگم!

بیسەلمێنە من تەمەنێکی ترم بۆ زەمان!

یار بۆنێکی ترە بۆ گوڵ ...

یار تەماشایە و

تەماشا بیستنێکی نوێیە بۆ هەست

یار حاشایە و

حاشا بەڵگەی سەربەستییە

مەڕەنجێ ئەی یار!

لە ترسی خۆکوشتنی گوڵ نەبوایە

حەرفێکم نەیدەپەڕاندی ...

برینی خاک نەبوایە

زامێکم نەیدەبواردی …

ئەی کۆنترین پەندی پێشینیان!

من بەربوونەوەی «گەیشتنم» لە دەستی میوە

ئەی ئەوەی «لەنجەت بەهێزترین بوومەلەرزەیە»!

من دابڕانی خۆمم لە خۆم بە سووکە ـ باـ یەکی تەنیایی

ئەی ئەوەی چاوت خۆرهەڵاتی ئاوە!

من سوێی پرسیارێکم لە خوڕە و شەپۆلی بێدەنگی

ئەی ئەوەی سێویکی و لەگەڵ تەنیاییم دووبەش کراوی!

من باوەڕێکم پڕ لە واوەیلای کفر

ئەی مۆجزاتی لەبیرەوەنەچووی ژیان!

من نەهاتووم بە بێ تۆ بم

بێ تۆ...

ئەم شیناییە دوورەی ئاسمان ... بۆچی بێ!

ئێوارێ بۆچی بێ و

بەیانی بۆچی!

٧٧/٧/١٠ تاکوو ٧٧/٩/٢٥

بۆکان

# وەرزی توانەوە

من پەنجەرەیەک نیم ئیتر
ئەی خۆرەتاو
رووناکم کەی
ئەتۆ
خاکی و
ئاخ!
کە من ئیتر هەورێک بەقای پێم نەماوە
بە باڵاتا ..
بی
با
رێ
نم ...
تۆ بەدوای پەیکەرەیەکی وندا وێڵی و
من بەردێک نیم

که دامتاشی!

***

گوڵ هەر گوڵ بوو

داریش هەر وا سەوز دەبوو

ئەگەر زریان نەهاتایە!

ساڵی جارێ باغچە کۆچ کات

زەرد دەبێ رەنگی باڵندە

من دانیشتووی وڵاتی باغ و

تۆ

کیشوەری بەجێهێشتن!

***

وێنەی چیا و رووبار و دار دەکێشمەو

وێنەی باڵندە و پەپوولە

ئاسمان بەشی باڵیان نەکا

گڕە مشقاڵ دەکێشمەوە

ئاور بەر دا ..

لە دەماری سووری هاوین

کەپرۆچکەیەک دەکێشمەوە

هەڵاشی لە ریشی «خانی» و

دەلاقەکەی بەقەت چاوی «خاتووزین» و

کۆڵەکەیەکی ..

وەک بازووی «کاکە مەم»یشی بەرئەدەم

ئاخرین ماڵی ژیانم

با کونجی ئەم خەڵوەتە بێ!

تۆ مێژووی و من داهاتوو

تا هەتایە ..

هەر دێم و .. دێم و .. دێم و .. دێم ..!

دوو هەزار ساڵی رەبەقە

مشتێ خۆڵم هەڵگرتووە و

باسی گەلاوێژ و شەختە

بەستەڵەک و نەورۆزی .. بۆ دەگێڕمە

تۆ لە کۆتایی زەمین و

خۆم لە ئەوپەڕی خوا

ـ دەنووسمەوە! ـ

نووسراوەکە .. مێژوویەک بێ

باوەڕ بکا .. سوڵتان دەمرێ!

گوللەیەک بێ

باوەڕ بکا .. خوێن ناسووتێ!

نامەیەک بێ

ناونیشانی .. کووچە، کووچە و

ماڵ بە ماڵی

هەموو دنیای لێنووسرابێ!

هەر دێم و دێم ...
با بە ڕێوە گیانم دەرچێ

تۆ چیرۆکی و
گەڵای وەریو نووسەرەکەت
تۆ وشەیی و
لە نێو فەرهەنگی ناسۆرای
شێعری سپیت
ئافریقای خواروو شاعیرتە و

لە ئاهەنگی گەردەلوولا
گۆرانی بۆ بەفر دەڵێی!

گەلاوێژی ١٣٧٦ ـ بۆکان

## سوور

ڕێگایەکی سوور

نیگایەکی سوور

دنیایەکی سوور

عەشقم سرроودە سوورەکانی هەنار و

تەنیاییم

خولیایی بۆ شێعرێکی مزری وەک ماچ!

٧٦/٦/١٥

بۆکان

# چرکەیەک لەگەڵ خۆم

پەنجەرە .. مژ دەگێڕێتەوە
دار .. هەڵوەرین دەخوێنێتەوە
حەوشە .. دیوار دەپارێزێ
کۆڵان .. هەنگاوی ناوەختی وێڵێک دەژمێرێ
عیشق .. بە ئیشتیایەکی ساردەوە دەڕوانێ و
تۆ نازانم لەکوێی!
من شێعر دەنووسم!

٧٦/٩/٦
بۆکان

# وەفاتی باغ

«بۆ شاعیری هاوڕێg:»

«تاقەتی زستانت نەبێ!»
دەبێ ناونیشانی دارێک
بۆ مەعموورەکانی ـ با ـ بڵێی!
سەوزاییەک ...
لەو پەڕی هین .. وانێک .. شت ..
تێ پەڕیوە
تەنیا شکیان لە جوانییە!

***

باوێشکی خەمی نێو خوێنم .. یار!
بە پەنجەرە بڵێ : گیانە
بە باران بڵێ: نازەنین

بە من بڵێ: هەتاوی عەسرانەی رەزبەر

به خۆت بڵێ: وەفاتی باغ

***

هێشتا تۆ وەرەز نەببووی

من زمانی تەنیاییم بیستبوو

لە خۆمەوە تاکوو گەیشتنەوە بە خۆڵ

شێعر ئەنووسم

لە تۆشەوە تاکوو هەتا هەتای زەمان

پەنجەرە و کۆڵان …

پەنجەرە و سەعات ـ٤ـ ی عەسر

***

یەکەم وەرزی عاشق بوونم

من پایز بووم .. پایزیش من

دووهەم وەرز ..

تۆ بەهار بووی .. بەهاریش تۆ

سێهەم وەرز ..

من بەرد بووم .. بەردیش من

وەرزی چوارەم

تۆ هیچ بووی .. هیچیش تۆ

***

ئێستا ...

من و تەنیایی

من و پەنجەرە

من و کۆڵان

من و سەعات ـ ٤ـ ی عەسر ...

٧٦/٩/١٦

بۆکان

## ڕێگا

«بۆ یەڵماز گۆنای»

ب
ا
ڵن
دە
ش ە هی د گ ە ڵ ا
خ
ا
ک

چرای کامە لا سەوز بێ

زووتر دەگەمەوە لات!

***

ئەگەر ببی بە باڵندە

هەموو جیهان هەڵدەفڕێ!

ببیە گەڵا

هەموو جیهان سەوز دەبێ

ببیە شەهید

هەموو جیهان دەپشکوێ!

ببی بە خاک

هەموو جیهان عاشق دەبێ!

٧٦/١٠/٢٥

بۆکان

# سێ کورتە شێعر

«١» کچ

نە بۆ جوانیت
نە بۆ ژیریت
بۆ دایکبوون خۆشم دەوێی

٧٦/١١/٦ ـ بۆکان

## «٢» پەیمان

مالّم نییە
وەرە ئاوارەییمەوە!
لە کەس ناچم
وەرە نێو تەنیاییمەوە!
لە هیچ کەسیش ترسم نییە
وەرە نێو ئازادیمەوە!
٧٦/١١/٦ ـ بۆکان

## «٣» ئارەزوو

جوانی سامانی ئەوینە
ئازادی سامانی خاکە
تۆ سامانی هەر دووکیانی
ئەی ئارەزوو!
٧٦/١١/٦ ـ بۆکان

# نیاز

ئەوەندەی تینوویەتی گوڵێ
نە بۆ هەور
نە بۆ زەریا
ـ خۆشەویستە ئاوـ
بەقەت گۆرانی شنە ـ با
نە بۆ شەڕ و
نە بۆ ئاشتی
ـ گەورەیە خاک ـ
وەکوو پێکەنینی منداڵ
نە بۆ مەرگ
نە بۆ ژیان
ـ جوانە دایک ـ

ئەوەندەی ئازادی مرۆیٚ

نە بۆ پەرەستن

نە بۆ لاڕێ بوون

ـ عاشقەخواـ

٧٦/١١/٦

بۆکان

# پردی ئاوێنە

لەگەڵ کۆچی دوایی مارف ئاغایی و جەعفەری قازی

زاتیان نەدەکرد کە پیر بن
چونکە هەزارساڵی تەمەن
بەقەت مردنی پێ ناچێ
زاتیان نەدەکرد کە بڕۆن
چونکە ڕێگای هەموو کۆچێک
ئەوەندەی جودایی دوور نییە
نهێنییەکیان لە دڵدا بوو
نەیاندەویست بیدرکێنن ...
لە پرسەی ـ دایە حەواـ دا
ئەلفاتیحا ... درکاندیان ..

دركانديان و رۆيشتن ...

***

لە وێستگەی هەموو بارانێک

ئەو دڵۆپانەی دانابەزن

لە ترمیناڵی هەموو ساڵێک

ئەو رۆژانەی زۆر بە پەلەن

لە ئوتێلی هەموو یادێکا

ئەو موسافیرانەی ناخەون

ئەوانن ...

نهێنی وشە و رەنگن ...

ئەوانن ...

پێیان بڵێن: سەفەرتان خۆش!

***

بە دیتنی خاک

چاویان لە سەریەک دادەنێن

بە بیستنی خاک

هەر چوار پەلیان بە زەویدا رادەکێشن

حەزیان لە رۆژنامەیە و

رووداوێکیان لە بیر ناچێ

حەزیان لە ساڵە و

لە ناوەختە وەرزێکا

ژاوەژاوی وەرزێکی‌تر دەنێنەوە
جاری واشە حەز لە نهێنی دەکەن و
شوێن پێی تەنیایی هەڵدەگرن
حەز لە غەمگینی و
سەما بە بێ دەنگی دەکەن
هەر ئەوانن ...
نهێنی وشەو رەنگ ...
لە گوڵە گەنمی تێر دەگەڕێن
لە دارمێوی وشیار ...
مێژووی لەدایک بوونی خۆر ...
پێیان بڵێن:
سەفەرتان خۆش!
***
قرچە قرچی «پردی برووسکە» ...!
نا ... نا ...
ئەوە دەنگی شەیپووری خۆرە دێ
دەنگی زەماوەندی شیرینە ...
من بە تەنیام
شیرین دەگری ...
من بە تە ن ی ا م
ئاوێنەکەی باخەڵی پەنجەرەیەکە
هەر خۆی لەوێڕا هەڵداوێ و

دەشکەوێتەوە نێو باخەڵی خۆی ...

شیرین دەگری و
من هەست دەکەم ..
ژنێک .. پەنجەرەکەی و ... باوەشی و ...

شیرین گوێی لە دەنگی ئاو بوو!
گوڵدانەکەت لە کوێ دانا؟!
ـ دەنگێکی نوێ!ـ
ئاخ بێدەنگی!
ئەم گوللە وێڵانە لە کوێرا دێن!
هەموو لەشم زامار بووە .....

شیرین دەگری و
پێکەنین و گوڵدانەکەی هەروا لە باوەشیدایە
پەنجەرە و خۆهەڵدێرانەکەشی ...

هەروا لە باوەشیدایە
ئاخ ساتەکان!
ئەم هەموو مەرگەتان لە کوێ بوو؟!
چ وتەیەکی دڵ پڕ .. ..
چ بەیانێکی ناسک .. ..

ئاخ .. ئاخ!

شیرین دەگری و

فەرهاد و نە ...

پێکی زامێکی لەگەڵ بنۆشێ

فەرهاد دەمرێ و

شیرین و نە .. .

چۆرێ ئاوی بە دەمدا کا

شیرین دەگری و

ورتەورتی برینەکان

شیرین تەنیایە و

دەنگی بەرزی قوڵینگەکان

بیرەوەری پڕ دەکەنەوە لە فەرهاد

***

قرچە قرچی «پردی برووسکە!» ...

نا ... نا ...

ئەوە دەنگی ڕێڵی ئاوێنەکانە

پێکەنین ... فەرهاد ...

گوڵدان ... فەرهاد ...

پەنجەرە ... فەرهاد ...

خۆهەڵدێرانیش هەر فەرهادە

**شیرین!**

**فەرهاد بزر نابی**

**فەرهاد پردی ئاوێنەیە .. ..**

٧٦/١٢/٥ ـ بۆکان

(١) کاک مارف بە تەمابوو دیوانێک بە ناوی «پردی برووسک» بڵاو کاتەوەبەڵام دواتر ئە و ناوەی گۆڕیوە ...

## تۆ .. (!) .. من

ترووسکەیەک
دەنگت دایچاند و          هیچ!
بڵێسەیەک
لە چاوت و          هیچ!
خەرمانەیەک
لەسەر پێستی نێو چاوانت و          هیچ!
ـ تۆ ئەو «با» یە بووی
سەیرە!
ئەو «با» یەی خەونی دی ـ

له نێوان ئارامی و هەڵچووندا

هەستێک!

له نێوان خۆشەویستی و مندا

ئیشارەیەک !

له نێوان خەم و دڵخۆشیدا

تۆ!

تۆ ئەو بەردە بووی

سەیرە!

ئەو بەردەی باڵی گرت.

من نەبووم کە دەمڕوانی

تۆ بووی نیگامت شڵەقاند

چاوی تۆ نەبوو دەگریا

من بووم ... من

مانگم لە ئاودا دی

ـ تۆ ئەو مەرگە بووی

سەیرە!

ئەو مەرگەی من ژیام ـ

٧٦/١٢/٧

بۆکان

g

ولاتی شێعرین .. خەونەکانم

سامالی چاوت .. خۆزگەکانم

بارانی لێوت .. ماچەکانم

خەون

خۆزگە

ماچ

قەرز

قەرز

قەرزەکانم ...!

٧٦/١٢/١١

بۆکان

# بای .. بای ..!

لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەم

شەو و رۆژ

وەکوو دوو ڕێبوار

نەختێک دەوێستن .. ... سڵاوێک دەکەن ..

بای .. بای ..

هیچی‌تر!

***

که بیری ئازادی دەکەم

دەڵێم بارانی بەردیش بباریَ

شووشەی نێوانمان

بە حاڵ ناچڕژیَ

ئارەزوو و ئەوین

وەک جووتیَ کۆتر

نەختێک دەخوێنن .. .. .. .. پاشان هەڵدەفڕن ...

بای .. بای ..

گیانەکەم !

٧٦/١٢/١٦

بۆکان

دوێشەو کوتیان

باوەڕ بکەن هیچ نەبوە .. هەر لاقی شکاوە!

سبەینێ حەمە گیان پرسی:

بابەگیان کوا؟!

دایکی کوتی: ها. ها .. چوە بۆ لای خوایە گیان رۆڵەم!

ـ دایە! خوایەگیان لە کوێیە؟!

ـ .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. ...!!

ـ دایە! بۆچی دەگری!

بابەگیان بە لاقی شکاو چۆن چوو بۆ لای خوایەگیان؟!

خەڵک دەڵێن

ناشکوری مەکەن .. گریانی بۆ چییە .. هەموو دەمرین!

# کابووس

دوو ركات یادی شیرینی کاکم

جانتایەک کتێب ..

دوو دەستی سەوز ..

جادەیەکی پێچەڵاوپووچ ..

چ ئاشنان!

کابووس ئەڵێ

هەرەسێکی سوور، لەم رێگایەوە

خوێنی زامەکەی «کاکە سەیدەوانی» هێنا و

دای بە مێلاقەیەکی تینوو ...

بەفراو ئەڵێ:

لەو گوێ جادە

خۆم بە سەر و سنگیا هەڵپڕژاند

گەرم .. گەرم بوو دڵی ...

دوو ركات نوێژ ...

حەزی دەكرد

خەوێكی خەست .. لە سەر باسكی خوا بنوێ

دوو ركات بزە ..

دوو ركات پرسیاری ناوادە ..

بڕۆم ؟!

نەڕۆم ؟!

بڕۆ ... نەڕۆ ... بڕ ... نەڕ ... ب ... ن ...؟!

بڕۆی و نەڕۆی!

بەیانیان ..

تریفەی شینی شنە تۆی

نیوەڕۆیان

زریوەی زەردی تیشک تۆی

ئێواران .

هەنگاوی سووری هەتاو تۆی

دێیەوە لام ...

گوڵێک دەخوێنیتەوە بۆ بەهار و

ئاوێنەیەک بۆ هاوسەرەکەت

بزەیەک دەنووسیتەوە بۆ من و

ماچێک بۆ کوڕەکەت ...

ـ باـ بین دەنێتە سەرمەوە!

باسی باران

یان شتێکی وا ..

نا .. نا .. وا نییە .. نا!

نم نمەی فرمێسک

هەواڵی کۆچی دوایی تۆ و

شەلەشەلی ژیان

لە بەر تەنگی پێڵاوی مەرگ

نییە ... نا!

تۆ پێت وایە!

بە جێم دێڵی ..

بە بێ هەواڵ ..

بە بێ نامە ..

بە بێ تەوقە و ..

بێ پێکەنین .

نا ...

نا ...

خاکەلێوەی ٧٧

بۆکان

# ٦ـ چرکەی کاتژمێر لەگەڵ تۆ

(١)

زستان ..
کەفی کفریش هەڵخڕێنێ
گزنگی وتەی تۆ .. ئەی یار!
باوەڕی پتەوی منە
بە ڕۆژە گوڵاڵەییەکانی بەهار!

(٢)

دەتەویٚ؛ دڵم پڕکەی لە گۆرانی

لە بیٚ دەنگیتەوەم پیٚچە!

گەرەکتە سەرم خاڵی کەی لە غەوغا

لە وتەکانتم هەڵکیٚشە!

(٣)

خۆشەویستی ..

ناوی خۆیمان لیٚدەپرسیٚ و

ئیٚمە ...

٥. ...٥ .٥. ...٥

لە دڵەوە پیٚدەکەنین!!

(٤)

لە تاریکە شەوانەوە پەل دەکوتین و

هەست بە لەشی جیهان دەکەین

ئیٚمە ..

ئارەزوویەکی تینوو و بەلەسەین

هەر بەتەنیاـ ئارەزووـ ش

تینوویەتیمان دەشکیٚنیٚ!

(٥)

چ رۆژانیٚک .. هاتن و چوون!

چەندە عیشق و مەرگ و ژیان

تێپەڕ بوون

هاتن و

چوون

بەند ناکرێ

ـ تۆ دێی و دەچیە تەنیاییمەوە!ـ

(٦)

چ شەوگارانێکی تاریک

گوێ بە تەنیایی دەسپێرم

بێدەنگی ئارەزووە گەورەکانت دەبیستم!

چ شەوگارانێکی تاریک

چاو لە ئاسمان دەبڕم و

ڕووناکایی

لە خەیاڵما .. دێت و

دەچێ!

٧٧/٤/٢٤

بۆکان

# یەقین

دەنووسم ـ باـ

دەبیە گەڵای بەرزترین چڵووکی دار!

دەنووسم ـ نان ـ

دەبیە سفرەی هەژارترینماڵی شار!

دەنووسم ـ ئاو

دەبی بە کیشوەری باران!

دەنووسم ـ مەرگ ـ و

تۆ دەبی بە ئاخر زەمان!

٧٧/٤/٣٠

بۆکان

# باوەڕ

بۆ مامۆستام «ئاسۆ»

مانگ دووریش بێ
پەیژەی ئارەزووش ناسک
بشکێ
نەگەم بە هیچ
تەنیا تراویلکەی تیشک
کیفایەتە
من شێعرێکی لەبەردا دەنووسم!

٧٧/٥/١١

بۆکان

## ١+١=٢

بۆ هاوڕێیان: ڕەسووڵی سۆفی سوڵتانی و
فەوزیە سوڵتانبەگی

تۆ ناگەیتە ئەو موچوڕکەی
بۆ خۆت ئاوقای دڵت کردم
من بە تەنیایی بێ کۆتاییمدا سەرم هەڵگرت
بە گریاندا بە عیشقی ڕووبار
بە ڕووباردا بە عیشقی دەریا
بە دەریاشدا بە عیشقی ئاو

-

زەمزەمەی زوڵاڵی .. .. .. ..ـ
سەرهەڵگرتن
گەڕانێکە بەدوای هیچـ دا

دوورڕێیانێک

بەجێ

دێڵم

بەڕەهووتێکم دێتە بەر .. ..

مێژوویەکە تەنیایی وەدوام کەوتوە

بێدەنگی بەربینگی پێ گرتوو

ئاوارەیی .. داهاتوومە

مێژوویەکە لە تۆدا دەسووڕێمەوە

تۆ

سەرەتای خۆت و

کۆتایی من!

سەرهەڵگرتن هیچی نەکرد

تۆی بردەوە و

منی دۆڕاند!

ئێستا ..

بە هەناسەکانمدا دەگەڕێمەوە

سەر ..

یەکەمین ترووسکەی رۆح

بە خۆم و بە خوا ئاشنا دەبمەوە!

کارێکیش جێبەجێ دەکەم ..

هیچ نەبێ ... میوە فرۆشتن!

شیرینە ژیان .. بە شەرتی چەقۆ!

ناسکە مەرگ .. بە لێو دەخورێ!

لەم بازاڕەدا ...

سێوە سوورەی کوڵمی (وەفا) خێری نییە!

بەڵام هەرگیز ..

سەرم بچێ .. ئەتۆم ناچێ

بمانبوورن ئەی قسە مەییوەکانی گەروومان!

ئاسمانی ئێمە شین نییە!

پەنجەرەی ئێمە بەرەو خۆمان ناکرێتەوە!

هەوری ئێمە ..

رەشێکی مەیلە و بۆری سووتاوە

وەرن وشەیەک لە منی سەرشێت دادڕن

چۆن وەدوای شێعری لار کەوتووم!!

چاوم ناپەڕێ!

پۆلە پەپوولەیەک ..

هەر هەمیشە لە نیگامدا باڵ لێدەدەن

رووناکییان لە من دەوێ

ترووسکەیەک !

بڵێسەیەک !

لێم ببوورن پەپوولەکانی چاوەڕوانی!
تاوانی منە جیهانی ئێوە تاریکە ..
دەزانم ..
دەستی ئێوە لە هی من دەچێ
چاوتان .. لێوتان .. هەموو شتێکتان
ڕۆژێک هەواڵی گڕ ..
لە پشت شووشەکانی خولیاییمەوە
دەگاتە گوێتان!
ئێستا من خەون دەبینم
خەون بە ئیشڕاقەوە
کە ئیتر بەڵگەیەک بۆ لاڕێبوون نەمێنێ!
خەون بە میوە فرۆشتنەوە
کە ئیتر بەڵگەیەک لە دەستی جوداییماندا نەمێنێ!

باوەڕ بکە خەون دەبینم!

دارەکان بە گەرووی ـ باـ گۆرانی دەڵێن
من و تۆ
هەوری باراناوی دەناسین و
بانیماڵەکەمان سواغ دەکەین!

خەون بە تۆوە

که لە تەنیاییدا دێیە لام

بێ هیچ ویستنێک!

لە تەنیاییشمدا دەژی

بێ هیچ

نێوانێک!

٧٧/٧/٨

بۆکان

## ئوولیس مەسیحی کفر

سەیر کەن کاکۆڵە شەرمنەکانی ئاسمان
زووخاوی خوایان لێدەڕژێ...
سەیر کەن ئەم دەستە عاشقانەی من
چرکە.. چرکە.. شەو بە رەشی لە بسکە پەتیارەکانی یار
دەکەنەوە
سەیرکەن دارستان
نۆبەرەی خولیاکانی خۆی دەخاتە رۆحی ئێمەوە

سەیر کەن ئاسمان

چۆن دەمی ئەو ئەستێرانەی پێ ناگیرێ..

کە لە ناونیشانی ئێمە دەپرسن

سەیر کەن یارم

چۆن ئامێزم پیا دەکات و

دەڵێ: سڵاو ئەی ـ با ـ سڵاو!

منیش چەند بەگوڕ ماچی دەکەم و

دەڵێم: گیانە ئەی بەیانی گیان!

سەیر کەن ئەم برازایانەی خوێن

چۆن هاوار لە دوا قوڵپە و دوا نەعرەتەی ماميان دەکەن

دەڵێن: ئەی ژیانی جوان.. ئەی مامە!

ئەی لێکدانەوەی سوورەتەکانی رۆح .. ئەی مامە!

ئەی فریودەری مەرگ لەسەر نووکی خەنجەر .. ئەی مامە!

ئەی پەنجەت خولیای رەگ .. ئەی مامە

تۆ هاتی .. خەوی ئەم شەوانەمان زڕا و

فڕین ئێمەی برد

تۆ هاتی: دووربینەکەت دا بە هیوا

رەختەکەشت کردە شانی ئارەزوو

تۆ هاتی: کۆتر بەتامتر باسی گمەی دەگێڕاوە

قەقنەس بەجۆرێ باسی خۆسووتانی کرد.

ئێمە بووینە گڕ

تۆ هاتی: کوندەپەپوو تووشی دوودڵییەکی سەیر بوو

تۆ هاتی: ئیشراق خەونی بە پلەی لە تیشک تیشکترەوە بینی
ئێمە سوورتر بووین لە ئارامی ئەم زەریایە بکۆڵینەوە
بۆنی فرۆی ئەم هاتنەی تۆ
چی نەورەس بوو کردیە دۆستمان
خۆرهەڵاتی باغ.. باکووری ئاو..باشووری دڵ..خۆرئاوای مەرگمان دی

ئەی دووپاتبوونەوە .. ئەی مامە!
ئێمە ئەو هومێدەی تۆ بۆت هێناین
بە دیواری کریستاڵی کاتمانەوە هەڵواسی
ئێمە.. پشکووتنی گوڵی ترمان دەوێ..بەدەم ئەم هەموو جریوەی زامەوە
ئێمە.. پەرداخی پڕترمان دەوێ..بەدەم ئەم هەموو تریێی مەرگەوە
ئێمە .. برینی دیکەمان دەوێ .. بۆ ئەم خوێنە خەستە
دەفتەری گەورەترمان دەوێ .. بۆ نووسینی ئەم شێعرە مەستە

سەیرم کەن گەڕاومەتەوە بەر پەنجەرەی دڵدارییەکان
کچێک بەر لەوەی بمدزێ لێی پرسیم:
تۆ هەواداری کام عیشقی!؟
عیشقی ـ با ـ یان عیشقی ـ لافاو ـ !
چاوێکی سەوز
خۆی لە بەختەوەری باغ دادەگرت
دەیکوت: ئەم هەموو دەنکە هەنارە
بەڵگەی ڕەسەنایەتی خوێن و ملۆمۆیە بە شەڕدا

سەیرم کەن من خۆم لە کۆڵانی پەپوولەدا دیوە

بۆ ماڵی ژمارە خوداییەکانی گەنم دەگەڕێم

من عاشقی کچە ئەسمەرەکانی باڕووتم

وەک لەززەتی بەیەکەوەنووسانی دوو عاشق لە کاتی نووستندا

بە سبەینێوە نووساوم

سەیرم کەن زایەڵەی ئەم گیتاری پرچانەی یار

لە زرمەی ئەفسانەی ئێوە قووڵتر دەچێتە ناخی جەستەمەوە

سرتە نهێنییەکانی مامم لە هاواری ئێوە بەرزتر دەبیستم

ئەی ئەوەی لە ژێر عیرفانی سووری دووریدا ئاشنام بووی

ئەی مامە!

من دەمەوێ حەقیقەت بدۆزییەوە

لەنێوان تەمەنی گوڵاڵە و خەونی سەدەدا

سەرم لە جەزمەی هەڵفڕیندا بشۆیەوە

من دەمەوێ لە تێگەیشتنی فەزا و پەنجەرە بنووسی

گەیشتن بە سەد گزنگ

ئەوەندەی ژوانی تیرێژێک نییە

کە دووپات نابێتەوە هەرگیز

من دەمەوێ...

ویستن وە شوێن گەمە کەوێ

ویستن گۆرانی بڵێ

ویستن دڵداری بکا

ویستن ڤۆدکا و شامپاین بخواتەوە

ویستن پێوەدانی مێش بە قامکی ئازادییەوە نەبێ

ویستن خوێندنەوەی کتێبێک بێ کە بێدەنگی مەحکووم دەکا

ویستن مەیخانەیەک بێ لە ئەوپەڕی مەستیدا..

من بە دەم مۆسیقای تەڕی ئاوەوە ... خەوم سووکترە

من ڕەنگم بە دەم قاقای بێدەنگییەوە ... جوانترە

من مەرگم ژمارەی لاپەڕەکانی مێژوو بێ ... پاداشم زیاترە

ترپەی پێم لە کۆڵانی خولیاوە بێ ......... بەرزترە

هاتوچۆم لە ئەندێشەی ئاودا ................ خۆشترە

من دەزانم پەلامارەکانی مردن

بەقەت جریوەی چۆلەکەیەک

لەشی گوڵ وە لەرین ناخەن

دەشزانم کتێبی کارەساتەکان

لە کۆتاییدا هەڵئەدرێنەوە

ئەی هەنووکەی ڕەها و بێسنوور ... ئەی مامە!

تۆ بێژە پەشیمانی بەرامبەری لەدەستدان نییە

بڵێ شەونم تفی بەیانییە بە نێوچاوی تاریکییەوە

دەست بنێ سەر خاک و بێژە .. ئەمەیە «هەمیشە»

بنووسە ژیان و بڵێ ................ ئەمەیە «ئێستا»

ئەمە سەردەمێکە .......... لە مردووەکان مردووترین ... بۆ!؟

ئەمە سزایەکە .......... لە گوناحەکان گوناحترین ... بۆ!؟
ئەمە دروشمێکە لە هەموو فریوێک درۆتر ... ئاخ!
ئەمە ژەهرە و سبەینێ خۆشەکان بە تەمان شەڕاب بێ ... ئاخ!

ئەمە ئاسمانی ژوانێکە .... دڵدارە کورتەباڵاکەم
ناگاتە نزمترین ئەستێرەی ... من چۆن باسی دوارۆژ بکەم چۆن
کێڵگە هاوار لە باران دەکا ... من لە تۆ ئەی مامە!
من لەگەڵ تۆ بانگهێشتنی دنیا دەکرێم
دەچمە سەر سنووری خۆرنشین
دەچمە سەر سەرەوەی رۆح
دەگەم بە فامی رووناکی شێعر
من بە دڵدارەکەم دەگەم
ئەو لە نەورۆز سەرەتاترە
ئەو خەڵووزی مێژووە لەبیرچووەکان دەبووژێنێتەوە...هەناسەیە ئەو
ئەو تەنیاییەکان لە بیرەوەری باراندا دەشواتەوە ... فرمێسکە ئەو
ئەو چاوی سینەمای ئارەزووەکانی منە ........ یەڵمازگۆنایە ئەو
«تا وشەکانی نەوەرن بێرەنگە زام» ........... شێرکۆیە ئەو
لەبەر ئاوێنەی ئاوردا پرچی دادێنێ .......... هەڵەبجەیە ئەو

ئەی پارێزگاری نەریتە شەڕاوییەکان ئەی ئێمە!
با تەمای سپی‌تر لە سپی دڵمان بگرێ
با چاومان لە هەڵۆ.. هەڵۆتر بفڕی
با دڵنەوایی درۆمان .. بە لاوکی راستی بکرێ
با بەرژەوەندی برینمان ... ودمی شەهید بێ نەک لۆکە

من چیم لە دەست دێ ... ئەی ئێمە !
هاواری ئەم شەپۆلە نەکەین ... دەخنکێ
پاشماوەی ئەم باخە نەبەین ... دەوەرێ
من چیم لە دەست دێ ... خانم.
گڵاوە ماچی ئەو لێوەی، هاودەمی هەڵوێست نەبووبێ
پەنجەم ئەو مەمکانە ناگرن، بۆنی رەجمکردنیان لێنەیە
هەناسەم ئەو قژانە نامژێ، کە زاراوەی گیا نەزانن

من چیم لە دەست دێ ... ئەی شێعر!
شەرحی ئەم حەقیقەتەی من نووسیم ... با ـ ش نووسی
هەڵفڕینی ئەم خەیاڵەی من کردم ... کۆتریش کردی
وشەی ئەم فەرهەنگەی من دیمەوە ... لە کتێبی یاسای کۆمەڵیشدا بوو

من دەبێ بڕۆم!
بگەمە پانتای پێکهاتنەکانی تەنیایی
زەمان تاکوو هەڵۆکانی هەمیشە
بە چیا بەرزەکانی ویستندا هەڵکێشم
من دەبێ وا بکەم ئەگەر پەنجەرەش نەمێنی
لە درزی دیوارەوە خۆم ببینم
ئەگەر مەخلووقێک نەمێنێ
لە دەرەوەی هەموو شتێکەوە دیدەنی مامم کەم

من دەبێ شوێنی هەموو ئەو جێگا بزرانە بم

کە هێشتا لە ژێر نیسێی گوڵاڵەدا دەنوون

سەیر کەن زەویش ئەگەر کۆتایی بێ

سەرم هەر پڕە لە باغ

سەیر کەن ئاوێنەش نەمێنێ

چاوی من پڕە لە مامە

سەیر کەن زەردەشت ئەدوێ

زەردەشتی نوێ

جولجوتای کردۆتە ئاورگە ... ئاورگەی خاچ .. ئاورگەی نوێ...

سەیر کەن هۆگۆ ئەدوێ و

شەقامەکەی ژان‌واڵژانی تیا دیل کرا

بۆتە کیشوەری برسییەکان

سەیر کەن نیچە ئەدوێ و

ئەو مەکتەبەی دجالی ئەتاساند

بۆتە قودرەتی بەردەکان

سەیر کەن هۆمێر

بە وشە ئوولیس رەجم ئەکا

ئوولیس تف لە ئەفسانە دەکا

ئەفسانە شەق لە یۆنان دەدا

سەیر کەن مایکۆفسکی

«زگکتان ئەکا بە سفرە

جارێکی‌تر ... زگکتان شەق دەکاتەوە

لێرەڕا هەتا ئالاسکا»

سەیر کەن کریستۆف کولۆمب

بەرد لە چۆکی خۆی دەدا و

نەخشەی سەفەرەکەی ئەدڕێنێ

سەیر کەن مووسا پێغەمبەر

بە مست دمووپلی رەسالەتەکەی ئەشکێنێ و

تووک لە نەتەوەکەی دەکا

سەیر کەن من زیندوویەکەم .. تەک و تەنیا

سات بە سات زیندووتر دەبمەوە

من بە بێ فەلسەفە ... راستیم

من لە دەربەندا .......... رەهاییم

من بە بێ هیچکەس ........... زۆرم

من پێکهاتنی پەنجەرە و تکای تیشکم

من نووستنی زەمانم لە لانکەی مێژوودا

من نامورادی ئێوەم

ناونیشانی جێگا بێشوێنەکانی ـ با ـ م

ئێوە چین؟

سێدارە ... پەت ... ژەهری پێکەنین ...

سواوە ئەم ئاکارەتان

کۆنە ئەم رەوشتە ... هەیهوو !

مردن من ناتوانێ .. نا ....!

بگەڕێنەوە

ئەی ئێوە کە بوونەتە سێبەری من!

بگەڕێنەوە

عیشقی من تاریکی بە دەمەوەیە و بە سەرتان دێنێ

«زامی دەمتان چلکی پێکەنینی هەڵێناوە»

خەوی نیوەڕۆتان بە گمەگمی ئەم کۆترانە زڕاوە

بگەڕێنەوە

بۆ لەدایکبوونی من

جیهان هەمیشە دووگیانە

ئەی خودایە!

کەی دەڕوێت .. گوڵی سووری برین لە شێعرمدا ... خودایە!

خەوی ئەو گوڵانەی من نەکووژن ... لە دوایین دەرفەتی بەهاردا

باران پێوەیان دەمرێ

خۆ ناکرێ باخێک بێدەنگ بێ و

پۆلە مەلێکیش ... بێمەیل و ماندوو ... پیر بن

ناکرێ تۆ فیتوو لێدەی و

ئەو ئەستێرانەش .. دانە دانە بمرن

«من گەرەکمە» .. خۆشم نەیلێم ... روانینم دەیلێ

«من عاشقم» .. خۆشم نەیلێم ... رەنگی گۆنام ئەیدرکێنێ

«نوێبوونەوە» .. منیش نەیکەم ... کاری هەمیشەی خوایە
سەیر کەن ئەو خرخاڵانەی لە مەچەکی ئێوارەدا خرینگەیان دێ
چەند لە رۆژ ئەچن
ئەو هەموو دەلاقەی بە شەو ئاسمان دەیانکاتەوە
چەندە شێوەی ژوان ئەدەن
ئەو هەموو باڵە وەریوەی پەپوولە
چەندە لە پەلکوتان ئەچن
سەیر کەن و ئیمانتان نەچێ
کە مەحشەری ویژدانی مێژوو هەستا

کوانێ تەنیایی من ... کوا؟
حەقمانە لە ئاویلکەدا دەمدەمانێکی یەکتر کەین ... کوا
ئەوەتانێ هەناسەی من ... ئەوەتا!
رەوایە یەکتری هەڵمژین

من برازای «سەرکەوتنم لە شەڕدا»
برازای «ئازادیم لە ژیاندا»
رەوایە مامم ببینم
پێم بڵێ: ئۆخەی .. ئەی کۆرپەی ئارەزووم .. ئۆخەی!
پێی بڵێم: گیانە .. ئەی پەرژینی ژیانم ... گیان!
پێم بڵێ: حەسامەوە .. ئەی وەجاخی روون .. ئۆخەی!
پێی بڵێم: سپاس .. ئەی هەمیشە هیوا .. سپاس!
رەشەمەی ١٣٧٧ / بۆکان